ناوی کتێب: کۆمەڵگەی ئیسلامی

نووسینی: سەید قوتب

وەرگێڕانی: جەمال گردەسۆری

پیتچنین: محەمەد عەبدولقادر گردەسۆری — [illegible] شەمسەدین

نەخشەسازی ناوەڕۆك و بەرگ: ئاسۆ

قەبارە: ١٥ — ٢١

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپ: چاپخانەی پالێت

لە زنجیرە بلاْوكراوەكانی (كتێبخانەی كاك شێخ).

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**ژمارەی سپاردنی (٣٦١) ساڵی (٢٠١٢)ی پێی دراوە**

سەید قوتب

# کۆمەڵگەی ئیسلامی

وەرگێڕانی

جەمال گردەسۆری

( كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ )

سورة آل عمران (١١٠)

# ناوەرۆك

# وتەیەك

هەریەك لە ئێمەی موسڵمان كە باوەڕمان بەوە هەیە خودا تاكە و خۆشەویستیشمان موحەممەد (د.خ) پێغەمبەرمانەو دوای مردنیش جارێكی دیكە بۆ یەكجاری زیندوو دەبینەوەو لێپرسینەوە لە سەر ورد و درشتی كردارەكانمان دەكرێت و دانە دانەیان دەخرێتە سەر تەرازوو و پێوانە و كێشانەی حاكمی عادل _ مالك یوم الدین _ پەروەردگارەوە، ئەوا پێویست دەبێت چەندی زووە و بە هەرچی شێوازەك كە هەیە خۆمان بەتەواوی شارەزای ئاین و بەرنامەی ئیسلام بكەین تا تەواوی فەرمانەكانی كە سوودمەندی دونیا و دوارۆژن لە خۆماندا بهێنینەدی و لەتەواوی قەدەغە كراوەكانیشی كە مایەی خەشم و قین و تووڕەیی و سزای پەروەردگارن دوورەپەرێزی بكەین، بەندە دوای ئەوەی ئەو نامیلكە بەنرخ و سەنگینەی باوەڕ گەرموگەش و نووسەر و گەورە پیاو و بیرمەندی ئیسلام و

موسـڵمانان، پێـشەوای شـەهید (سـەیید قوتـب)م خوێنـدەوە، ئەوەم بۆ ئاشکرابوو، کە ئەم باس و بابەتە سوود بەخشییەکی زۆری تێدایە بۆ شارەزابوونمان لە کۆمەڵگـەی ئیسلام، بۆیـە بـە پێویستم زانی بیخەمەسەر زمانی کـوردی، ئیـدی خـودای گـەورە تـەوفیقی دام و ئـەم شـەرەفەی پـێ بەخـشیم و لەسـاڵی ١٩٩٤ بـەفۆتۆکۆپی چـەندان دانـەم لێ چـاپ کـرد، دوای شـەش سـاڵ لەبەر گرنگـی و بایەخداریی بابەتەکـە جارێکی تـر لـە گۆڤـاری خۆری ئیسلام ژمارە (٧) ی نیـسانی سـاڵی ٢٠٠٠ بـڵاوم کـردەوە بـەو ئومێـدەی ژمارەیـەکی زۆرتـر لـە موسـڵمانانی کوردزمـانی وڵاتەکەم سـوودی لـێ ببیـنن و منـیش لـە خەزنـەی میهرەبـانیی پـەروەردگارەوە پاداشـتی زیـاترم دەسـتکەوێت، ئێـستاکەش وا بەشێوەیەکی جوانترو بێ کەموکوڕی تر(کتێبخانـەی کـاك شـێخ) ئـەرکی چـاپکردنی گرتۆتـەوە ئەسـتۆ، بـەو هیوایـەی توێـشووی دوارۆژ بێت بۆ ئەو، ئێوەی خوێنـەریش بەهرەمەنـدبن لێـی و ببێتە مایەی سوودمەندی دونیا و ئاخیرەتتان.

وەرگێڕ

بەهاری ٢٠١٢

# سیستەمی ئیلاهیی

پێش هاتنی ئایینی ئیسلام و دوای هاتنیشی مرۆڤایەتی گەلێ یاسای کۆمەلایەتی بەخۆیەوە دیوە، بەلام سیستەمی کۆمەلگای ئیسلامی تاکو ئێستاو بەردەوامیش سیستەمێك دەبێ بێ هاوتاو چاکترو دیارتر لەهەموو یاسا کۆمەلایەتیەکانی ترەوە کە مرۆڤایەتی ناسیویەتی، خالێ سەرەکی جیاواز لەنێوان سیستەمی ئیسلامی و هەموو سیستەمەکانی تر ئەوەیە کەوا سیستەمێکی یەزدانی یەو ئەوانی تریش هەلهێنجراوی ناخ و بیری ئادەمیزادن و لەلایەن مرۆڤەوە دانراون، ئا لێرەوە هەموو دژایەتییەکان سەرهەلدەدەن کە هەیە لەنێوان چۆنیەتی سیستەمی ئیسلامی و چۆنیەتی ئەم سیستەمانەوە، هەروەها لەنێوان چۆنیەتی کۆمەلگەی ئیسلامی و کۆمەلگەکانی ترەوە، بۆئەوەی چۆنیەتی ئەم دژایەتی یە سەرەکی یە بەشێوەیەکی فراوان بدۆزینەوە ئێمە دەلێین:

یاسـا کۆمەلایـەتی یـە دانراوەکـان دەسـتکردی مـرۆڤ و کۆمەڵگەیـە، ئـەو دەیپـارێزێ و دەیگـونجێنێ بـەگوێرەی پێداویستیەکانی خۆیەوە، یان بەگوێرەی لێکدانەوەکانی، کەچی کۆمەڵگـەی ئیـسلامی دەسـتکردی شـەرعیەتێکی ئیلاهـی یـەو خاوەن بنەما و ئوسولێکی چەسپاوەو لقەکانیشی لەجولەدایە، ئەم کۆمەڵگایە لەئەنجامی شەرعیەتی ئیلاهـی یەوە پەیدابووە. خـۆی لەگـەڵیا گونجانـدوەو بەسـتراوەتەوە بەبۆچـونەکانییەوە، هەر لە بنەڕەتەوە لەکاریگەریـەتی ئـەو دروسـت بـووەو گەشـەی کـردووە. خـوای گـەورە دەفـەرموێ: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) سورة آل عمران (١١٠) ووشـەی (أُخْرِجَتْ) مانایـەکی تـەواو دەدات لـە ڕاسـتەقینەی دروسـت بـوونی ئـەم ئوممەتـە، هەروەها چۆنیەتی یاسا کۆمەلایەتیەکانی،

کۆمەڵگەیەکـە دەرهێنـراوە بـەدەرهێنان هێنراوەتـە مەیدانـەوە بـەگوێرەی ڕێگایـەکی دیـاری کـراو.. کـە لەسیـستەمێکی دیـاری کـراودا ڕەنـگ دەداتـەوە.. ئـەو خـۆی نەهێناوەتـە کایـەوە بـۆ ئەودۆخەی کەهەڵی بژاردووە.. خۆشی سیستەمەکەی لەخۆیـەوە دروست نەکردووە، بەڵکو ئەم سیـستەمەی بۆداڕێـژراوە، پاشـان لـەگوێرەی ئـەو هێنراوەتـە مەیدانـەوە بـەهێنانێکی ئیلاهـی و بـەگوێرەی سیـستەمێکی یـەزدانی ـ فەرمانڕەوایـەتی تـەنها بـۆ ئەوە لەم سیـستەمە یەزدانی یە بـێ هاوتایـە دا، فـەرمانڕەوایی بۆمرۆڤ نییە، فەرمانڕەوایەتی بۆ ئەمیرو خەڵك نییە، بەڵکو تـەنها

بۆ خودایە.. هەر لەسەرەتاوە خوا خۆی دانەری یاسا بووە، کاری مرۆڤیش بریتی یە لەجێ بەجێ کردنی یاسا ئیلامییەکە و بەئەنجام گەیاندنی، ئەوانیش لەئەحکامی جێ بەجێ کردن و بەئەنجام گەیاندندا پابەندن بەچەند سەرەتایەکی بنەڕەتی کەشەریعەت هێناویەتی، سەربەست نین لە وزارهێنان لێیان، واتە هەندێکی هەڵبژێرن و هەندێکی پشت گوێ بخەن، یان لەدەستکاری کردنی و گۆڕینیدا: (وَما كَانَ لِمُؤْمِنٍ ولاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ) سورة الاحزاب ٣٦.

(وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ) سورة المائدة ٤٩.

(وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) سورة المائدة ٤٤.

باس کردنی پێغەمبەر (د.خ) لەئایەتەکانی حوکم و یاسادانان دا دژایەتی نییە لەگەڵ وتنی فەرمانڕەویی تەنها بۆ خوایە و بۆ مرۆڤ نییە، چونکە پێغەمبەر (د.خ) هەرگیز بە پێش یاسا و فەرمانی خودا ناکەوێت و بەئارەزووی خۆی قسەناکات:

(إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى) سورة النجم ٤

بەڵی زانایانی شەریعەتی ئیسلامی جیاوازیان دەبێت لەتێگەیشتنی دەقەکان و لەدەرهێنانی حوکمەکان بەلاّم ئەم

جیاوازی یه سنورێکی دیاری کراوی هەیە، نابێت لەچوارچێوەی سەرەتا بنەڕەتیەکان دەربچێت:

(فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُول) سورة النساء ٥٩

بەمەوە فەرمانڕەوایەتی تەنها بۆ خوا دەمێنێتەوە و کۆمەڵگەی ئیسلامیش پابەندی شەریعەتەکەیەتی، ئەگەر لەم بنکەیە لایدا بەکۆمەڵگایەکی ئیسلامی دانانرێت بەگوێرەی لادانەکەی لەوەوە.

# سیستەمێکی تەواو

لەبەرئەوەی ئەم سیستەمە ئیلاهی یە، فەرمانڕەواییش تیایدا تەنها بۆ خودایە، جا هەموو پێویستیەکانی مرۆڤی بەتەواوی هێناوەو دابین کردووە، خوا خۆی دایهێناوەو هەرخۆشی شارەزاترە بەوەی دروستی کردووە، هیچ گومان لە هەڵبژاردنەکەی نییە بۆ بەندەکانی کە داناو زانایە، ئەو خۆی بۆتە وەکیل بۆ هەڵبژاردنی مرۆڤ کە چییان بۆ هەڵبژێرێت و دواجار بەقازانجی دونیا و دوارۆژیان تەواو ببێت، چونکە ئەوان کەس و زات و مەخلووقی بێ هێزن و زانیاریشیان کەم پێدراوە، بێ هێزی مرۆڤایەتییان کاریان تێ دەکا، ئارەزووی تاکە کەسییان کاریان تێدەکات، هەروەها دەکەونە ژێر کاریگەریەتی بەرژەوەندی تاکە کەسییان یان چینایەتیان، لای کەمەوە زانیاری یە کەمەکەیان کاریان تێ دەکا کەناتوانێ کۆی هۆو

ئەنجامەکانی تەمەنی کورتیان بخەنە بەرچاو، بەڵام کاتێک خوا یاسا دادەنێت بەدادپەروەرییەکی تەواوەوە ئیتر کەس ئەو قەناعەت و باوەڕەی نامێنێت کە خودا هەندێکی لەهەندێکی تر خۆشتر بوێت، کەهەموو بەندەی ئەون، بەڵکو هەمووی بەیەک چاو تەماشا دەکات، مەگەر ئەوەیان کە تەقوا و خۆپارێزیی زیاترە، هەروەها قەدەغە کراوە لەم سیستەمەدا مرۆڤ بکەوێتە ژێردەسەلاتی مرۆڤەوە چونکە هەرهەموویان ملکەچی شەریعەتی خوان (بەفەرمان ڕەواو خەڵکی ئاسایی ترەوە) بێ جیاوازی، ئەم تایبەتمەندی یە بۆ هیچ کەس و چین و توێژێک نی یە کەمافی یاسا دانان لەدەسەلاتیدا بێت، واتە مافی یاسا دانان هەرگیز مافی مرۆڤ نییە و بەدڵنیاییەوە لەتواناشیدا نییە،

سیستەمی ئیسلامی بێ کەم و کورتی یە و دەگونجێ بۆ هەموو کات و شوێنێك، چونکە داهێنەرەکەی (کە خودای زانا و دانا و کاربەجێ یە) خۆی کات و شوێنی دروست کردووە، هەرخۆی دروستکەری مرۆڤە لەهەموو نەوەکاندا، جا ئەم سیستەمەی دەوڵەمەندکردووە بەهێزو توانایەکی تەواو بۆدابین کردنی هەموو پێویستیەکانی مرۆڤ کە نوێ دەبێتەوە بۆ چارەسەرکردنی گۆڕانکاریەکانی مرۆڤ یەك لەدوای یەکەوە، بەردەوام ئەم گۆڕانکاریانەو پێویستیانە بخاتە ژێردەسەلاتی خۆیەوە

کەبەگوێرەی یاساکانی خۆی ماوەی پێ بدرێت، هەروەها بەگوێرەی بنەماکانی یەوە ئەم گۆڕانکاریەی کەپێویستیانە لەناو نابات، بەڵکو سازی دەکات بەگوێرەی مەنهەج و بەرنامە و بۆچوونەکەی و ماوەشی پێ دەدات پێش بکەوێت و گەشەبکات. پێویستە ئەم واتایە بەتەواوی ڕوون و ئاشکرابێت.

سیستەمی ئیسلامی کەشەریعەتی ئیسلامی پەیدای دەکات پێویستە دەسەڵات داربێت بەسەر ئەو گۆڕانکاری و پێویستیانە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، ئەو گەشەی پێ دەکات بە گوێرەی بۆچوونی خۆیەوە، نەك شل ببێتەوە لەڕوویێك لەڕووەکانی یەوە مل کەچیەك پیشان بدات بەرامبەر چەند باروودۆخێکی کۆمەڵایەتی کەلەدەرەوەدا تەنگەتاو و ناچاری دەکات، پێویستە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەرەو پێشەوە بچێت لەچوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامی یەوە، هەروەکو چۆن هەر لەسەرەتاوە دروست بوونەکەی لەوەوە بووە، ئەمەش بنەمایەکی بنەڕەتییە لە بەرەو پێشەوە چوونی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا.

# سیستەمێکی بێ کەم و کوڕیی

ئەم سیستەمە دامەزراندنەکەی بەوردی یە، بەشەکانی ڕێك و پێك و تەواوە، بچووکترین و گەورەترین شت لەبەشەکانییەوە ڕێك و پێکە، بەشێوەیەك ئەگەر لایەنێکی بخەینە پشت گوێ یان بەشێکی یان هەمووی بگۆڕین و یاسایەکی دیکەی لەشوێن دابنێین ئەوا ئەنجامێکی بێ کەڵکو بێ هودەی دەبێت، یاسا سیستەمێکە پێویستی بەتێك هەڵکێشان نییە، پێویستی بەوە نی یە پارچەو کەرەستەی سیستەمێکی تری دانراو و هەڵهێنجراوی ناخ و بیری مرۆڤی بۆ بهێنین، چونکە تیایدا بیرو باوەڕو خواپەرستی و سەودا کردن و ڕەوشت هەمووی بەیەکەوە بەستراونەتەوەو هەموویان لەیەك بیرو باوەڕەوە هەڵقولاون، چەند مەبەستێکی دیاری کراویان هەیە، دۆخێکی کۆمەلایەتی دێنێتە بەرهەم بەگوێرەی چۆنیەتی پێکهاتنی خودی خۆیەوە،

واتـه بـەگوێرەی ئـەو پـلان و ئـەرك و فـەرمان و ئامانجـەی کـە شـەریعەتە ئیلاهییەکـە دایڕشـتووە.. شـوێنەواری تـری لەگـەڵا ناگونجیٚ کەبەرهـەمی بـیر و فەلسەفەکانی دیکـەن، هەرچـەندە بەڕوواڵـەت دوورن لەبابـەتی بـیرو بـاوەڕ وەکـو مەسـەلەکانی ئابووری و دارایی. یاساکانی ئابووری ودارایی لەئایینی ئیسلامدا بەتونـدی بەسـتراونەتەوە بـە بیروبـاوەڕی (تەوحیـدی ئیلاهییەوە)ەوە _ کە بریتییە لـەوەی لـە هـەموو شـتێکا خـوا بەتاك بزانرێت لەهەموو هێز و دەسەڵات و بەخشش و سـوود پـیٚ گەیەنەر و زیان لیٚ لادانێك کە پەیوەستە بەژیانی مرۆڤەوە، واتە هەموو ئەو شتانەی کـە لـەوەوە سـەرهەڵئەدەن و بۆ ئـەو پـێش دێـن. ئـیتر ئـەم جـۆرە بینـشە پەیوەندییـەکی بـەهێزی هەیـە بـەدەقی ئایەتـەکانی بیروبـاوەڕ لـە شـەریعەت و قورئانەکەیـدا، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً) سورة البقرة ٣٠.

(وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ) سورة النور ٣٣.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ) سورة البقرة ٢٧٨.

لێـرەدا مـاوەی ڕوون کردنـەوەی ئـەم ڕاسـتی یـەمان نییـە بـەدوورو درێـژی تـەنها ئـەوە ڕوون دەکەینـەوە: کەپەیوەنـدی

نەپــچڕاوی نــاوەوەی بــیرو بــاوەڕی ئیــسلامی و یاســاکانی ئـابووری و دارایـی بەشێوەیەکە ناکرێت سیستەمێکی ئـابووری یان دارایی بینین لەدەرەوەی سیستەمی ئیسلامی، چونکە ئـەم سیــستەمانە دامــەزراوە لەســەر بنــەماو دارشــتەی فەلــسەفەی ترەوەو، کەم یان زۆر تێکگیران و پێکنەخواردن و دژایەتی هەیـە لەگەڵ ئەوبیرو باوەڕە ئیسلامییەدا کـە بەتوندی بەسـتراوەتەوە بەهەموو لایەنەکانی سیستەمی کۆمەلایەتی ئیسلامییەوە، لەگەڵ ئەوەشــدا ئــایین ســوود وەرگــرتن قەدەغــە ناکــات لەتاقیکردنەوەکانی مرۆڤایەتی، بـەدیاری کردنـی پێویستیەکانی کۆمەلایــەتی و هــەروەها لێــزانین و لێکۆڵینــەوەی و پاشــان لەڕێگاکانی بەجێ گەیاندنەوە،

ئـایینی ئیـسلامی چـەند بنـەما و مەبدەئێکی چەسپاوی هەیـە، بــەلام ڕێگاکــانی بەجێگەیانــدنی ئــەم بنــەما و مەبدەئانــە لەگۆڕاندایـە، لـەپاش ئەمـە ئێمـە ماوەمـان هەیـە کـەوا سـوود وەربگرین لەهـەموو تاقیکردنـەوەکانی مرۆڤایـەتی لـەم بـوارەدا، بەمــەرجێ زیــان نەگەیــەنێت بەســەرەتا و بناغــە پتــەو و چەسپاوەکانی ئـایینی ئیسلام، یـان تێڕوانین و یاسـا و ڕێـسا و بۆچوونێك لە بۆچوونەکانییەوە.

# سیستەمێکی سەربەخۆ

لەچوار ڕاستییەکانی پێشوودا کە باسکران، ڕاستیەکی تر سەر هەڵ دەدات ئەویش ئەوەیە سیستەمی ئیسلامی سیستەمێکە جیاوازو سەربەخۆ لەهەموو سیستەم و یاسا کۆمەڵایەتییەکانی تر کە زادەو دروستکراوی دەست و دید و بیر و ناخی مرۆڤن.. سەربەخۆ لەسەرچاوەکەیەوە، سەربەخۆ لە دروست بوونییەوە،سەربەخۆ لەچۆنی یەتی و ناوەڕۆکەکەیدا.. سەربەخۆ لە بۆ چونیەکانییەوە، هەرچەندە چەند پێچوونێکی لایەکی و لاوەکی و هەندەکی (جوزئی و جانبیی) هەیە لەنێوان هەندێ لە بەشەکانییەوە لەگەڵ هەندێ لەبەشەکانی سیستەمە دانراوەکاندا، بەڵام ئەم پێکچوونانە هەر بەڕواڵەتەو، سەرەڕای ئەوەش لاوەکی و لایەکییە، واتە جوزئییە و زۆر کەمە و

بـــەجیاوازی بنەڕەتیـــشەوە.. لەپاشـــدا ئەمـــە نـــابێ هـــەڵمان بخەڵـــەتێنی و وا لێکـــی بدەینـــەوە کەلـــەنێوان ئـــەوان و ئـــایینی ئیسلامەوە پەیوەندی و پێکچوون و هاوتـەریبی و هاوڕاستییەك هەیە و سازگارە بۆ دەست و دڵ بـۆ بـردن و کـەڵك وەرگـرتن بـۆ سیستەمی ئیسلامییەکە.. هەروەها ناشبێت هەڵمان بخەڵەتێنێت بەوەی بەرخاتری ئەو پێکچوونە ڕووکەشانەیە ئامادەبین چەند زاراوەیـەکی ئیـسلامی لابـەرین و هـی ئـەو بخەینـە شـوێنییەوە کەتایبەت بەخۆیەوە... نموونە بۆئـەوە: ئـایینی ئیـسلام مـاوەی موڵکداریەتی تاکە کەسی دەدات بەگوێرەی مـەرجی تایبـەتی... سیستەمی سەرمایەداریش لەسەربناغەی ئـازادی لەموڵکداریـەتی تاکـە کەسـی بنیـات نـراوە بەهـەڵ و مـەرجی تایبـەتی یـەوە، سیستەمی سەرمایەداری دامەزراوە لەسـەر ئـازادی موڵکداریـەتی تاکـە کەسـی، ئـەم پێـك چـوونە بەڕواڵەتییـە وامـان لـێ ناکـات کـەبڵێین! سیـستەمی ئیـسلامی سیـستەمێکی سـەرمایەدارییە، چـونکە بناغـە سـەرەکییەکانی هـەردوو سیـستەم زۆرجیـاوازن، سیستەمی ئیسلامی هەموو کەم وکورتیەکی نیشتیمانی ئیسلامی چارەســـەر دەکـــات، دژی ڕابـــواردن و پـــارەی بـــێ هـــوودە بڵاوکردنەوە دەوەستێ، هەندێ جاریش ئامۆژگاری و ڕێنمـایی چـۆنیەتی بەرهـەم هێنـان و سـامان خـستنە گـەڕ دەکـات..

سۆشیالیست هەندێ لەم ڕووانەی هەیە، ئەم پێکچوونە بەڕواڵەتەی نێوان هەردوو سیستەم وامان لێ ناکات کەبڵێین: سیستەمی ئیسلامی سیستەمێکی سۆشیالیستی ئیسلامییە، چونکە سەرەتا بنەڕەتیەکانی هەردوو سیستەم زۆر لێک جیاوازن، سیستەمی ئیسلامی ماوەی هەندێ سەرچاوەی گشتی داوە کە بۆ هەموو لایەك بێت بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەر (صل الله علیە وسلم) ﴿وَعَنْ رَجُلٍ مِنْ اَلصَّحَابَةِ – رضي الله عنه – قَالَ: {غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ – صل الله عليه وسلم – فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: اَلنَّاسُ شُرَكَاءُ فِي ثَلَاثٍ: فِي اَلْكَلَأِ، وَالْمَاءِ، وَالنَّارِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ , وَأَبُو دَاوُدَ , وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ﴾ (صحيح) رواه أحمد (٥ /٣٦٤)، وأبو داود (٣٤٧٧).

واتە تەواوی مرۆڤایەتی لەسێ شتا هاوبەشن، لە ئاو و گژو گیاو و لەوەرگە و هەروەها لە سووتەمەنیدا، هەروەها ماوە دەدات بەوەرگرتنی چەند مولّکدارییەکی تاکە کەسی و گەڕاندنەوەی بۆ سامانخانەی موسلمانان، یان دابەشکردنەوەی لەسەرکۆمەڵی موسڵماناندا، ئیمامی مالیك ڕێی ئەوەی داوە بە خستنەکاری سامانی دەوڵەمەندەکان واتە لێی وەربگیرێت و بەشێوەی قەرز لەکاتی پێویست بوونی سەربازی و نەبوونی سامان لەسامانخانەدا، هەروەها عومەری کوڕی خەتاب

(ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بڕیاریدا سامانی زیادی دەوڵەمەندەکان دابەش بکات بەسەرهەژاراندا، کەسێك پێی نارازی نەبوو، ئاییتی ئیسلام زێدەبایی و سووخواردن و ڕیبا بەهەموو شێوەیەك قەدەغە دەکات، کۆمۆنیستیش هەندێ لەمانەی هەیە، بەلأم ئەم پێك چوونە بە ڕواڵەتییە وامان لێ ناکات کەبلێین سیستەمی ئیسلامی سیستەمێکی کۆمۆنیستییە یان بەپێچەوانە، چونکە بنەماکانی هەردوو سیستەم بەتەواوی جیاوازن و یەککگرتنەوەی سەد دەر سەدیش لەنێوانیاندا بەهیچ جۆرێك نییە بەشێوەیەك کە هەموو هۆکار و بنەما و ئامانجەکانیان لەیەك بچن لەناوەرۆك و مەعنا و مەغزایاندا، فەرمانداریەتی لەئاییتی ئیسلامدا دامەزراوە لەسەرهەڵبژاردنی فەرماندەو دەست خستنە ناودەستییەوە بەگوێرەی پرس و ڕا لێك وەرگرتن، واتە شورا لەکاروباری بەڕیوەبردنە.. سیستەمی دیموکراتیش لەمە شتێکی هەیە، بەلأم ئەم پێکچوونە هەندەکی و لایەکییە وامان لێ ناکات کەبلێین ئاییتی ئیسلامی دیموکراتییە و ناشبێ زاراوەی دیموکراتیەت بخەینە سەرئاییتی ئیسلامەوە، چونکە ئاییتی ئیسلام گەلێ لەمە فراوانترە، سەرەڕای جیاوازی لەم بنەرەتییە کەوا بۆچوونەکانی لەسەریا دامەزراوەو هەروەها بۆچوونەکانی دیموکراتیەتیش هەروەکو ئەم زاراوەیە مانای

دەبەخشێت، سیستەمی ئیسلامیش سیستەمێکی ئیسلامییە هەر هەوڵدانێك بۆباسکردنی بەجۆرێکی تر کە وەرگیرابێ لەزاراوەکانی بیانییەوە کە چەمکی تایبەتی خۆیان هەیەو دروست بوونەکەیان دیاری کراوە بەهۆی سەرهەڵدانێکی مێژوویی ئەم زاراوانە، ئیتر نابێت و گونجاو نییە ئەم زاراوانە بلکێنرێت بەسیستەمی ئیسلامییەوە، ئەمە کارێکە لەموسڵمانان ناوەشێتەوەو هەڵەیەکی زانستیشە و دەبێ خۆیانی لێ بەدوور بگرن. (هەموو ئەوانەش مانای وا نییە کە بێ ئینصافانە بگوترێت دیموکراتییەت هەمووی بێ سوودە و هیچ خاڵ و بەندێکی بەکەڵکی مرۆڤایەتی نایەت، نەخێر.. بەڵام سیستەم و مەنهەج و بەرنامە و ئاینی ئیسلام تەواو و کامل و بێ کەموکورییە و ئیتر بۆ تەکمیلە بوونی پێویستی بەهیچ زیادەکاریی و بەرنامە و پەیڕەو و پرۆگرامێکی دەستکرد و زادەی ناخ و بیری مرۆڤ نییە).

# کۆمەڵگەیەکی خاوێن

نەژادی قووڵی ڕەوشت لەدامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ئەمەیان ئەنجامێکی سروشتی یە، چونکە لەشەریعەتی ئیلاهی یەوە هەڵقوڵاوەو پەیوەندیدارە بەسەرەتا بەرزەکانی ڕەوشت کە ئایینی ئیسلامی هیناویەتی و ڕەنگدانەوەی هەیە لە هەموو پێویستیەکانی ئەم کۆمەڵگەیە: لە ڕەوشتی تاکە کەسی و پەیوەندییەکانی خێزان و ئاڵوگۆڕی نێوان خەڵك و پەیوەندی دەوڵەتی ئیسلامی بەوڵاتانی ترەوە، کارێکی سەخت دەبێ باسکردنی زۆرێك لەیاساکانی ئیسلامی، لەوانە: مامەڵەکردنی ئابووری و نێودەوڵەتی بەبێ سەیرکردنی لایەنی ڕەوشت و لەبەرچاو نەگرتنی ئاکارە دەروونییەکانی، بەڵکو شتێکی دژوارە دامەزراندنی سیستەمێکی ئیسلامی بەبێ ئەم نەژادە ڕەسەنە، سنوورەکانی ئایینی ئیسلامی هەموو لەم نەژادەوە پەیدادەبن،

ئەمە ڕێگایەکە لەڕێگاکانی پاراستنی ڕەوشتی خەڵك و کۆمەڵگە، بەڵام یەك ڕێگا نیە، ئاینی ئیسلام لەم لایەنەوە سیستەمێکی پارێزەرەو، کارئەکات بۆپەروەردەکردنی ویژدانی مرۆڤ بەترسان لەخوا، هەروەها هەوڵدەدات بۆدابین کردنی مانەوەی مرۆڤ بۆئەوەی سنوور نەبەزێنن.. پاشان لەکۆتاییدا سنوور و شوێن قایم کردن دادەنێت لەکاتی پێویستدا، پاش ڕێگرتنەبەری هەموو هەنگاوەکانی پاراستن و چارەسەرکردنی پێش ئەوەی سزادان بەکاربهێنرێ، لەپاش ئەمە کۆمەڵگەی ئیسلامی ڕەنگ و ڕوویەکی کۆمەڵگەیەکی پاك وبێ گەرد وەردەگرێ، ڕەوشت کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەردامەزراندن و مانەوە و پاراستنی، هەروەها کارێکی گەورە ئەکاتە سەر یاساکان و ڕێنماییەکانی.. پیغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێت: ﴿عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-:«إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاَقِ﴾. أخرجه البيهقي (١٠/١٩١، رقم ٢٠٥٧١.

واتە من نێردراوم بۆتەواوکردنی ڕەوشتە جوان و چاك و پاکەکان، خوداش لەستایشکردنی ئەو پێغەمبەرە نازدارەدا دەفەرموێ: ﴿وإنك لعلي خلق عظيم﴾ واتە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی گەورەو پاك دایت.

# کۆمەڵگەی پاراستن و هاوکاری

ئەو بنەمایەی کەوا لەناخ و بنەرەتەوە کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەریدا دادەمەزرێ بنەمای پاراستن و هاوکارییە، کەوا باسی زۆرێك لە یاساکان دەکات، وەك یاسای زەکات و یاسای چاکە کردن و خراپە نەکردن و یاسای فەرمانکردن بەچاکە و ڕێگیری کردن لە خراپە، هەروەها فەرزەکانی کیفایەت هەمووی لەسەر ئەم بنەمایەوە وەستاوە، ئەم بنەمایەش بەدەوری خۆی دادەمەزرێت لەسەر بنەمایەکی ترەوە ئەویش بنەمای یەکێتی روح لەبەرەکان و هەبوونی یەك خواو بەسترانەوەی هەموو لایەك بەم خوایەوە، ئا بەم شێوەیە بیروڕای ئیسلامی بەئاشکرا دەبینرێت لە یاسا کۆمەڵایەتییەکەیدا، مانای بەخێوکردن و پاراستن لەئایینی ئیسلامدا زۆرفراوانترە لەو مانایەی کە ئەم زاراوەیە دەیدات لەسیستەمە دانراوەکانی تر، ئایینی ئیسلام مەبەستی ئەوەیە یاسایەك بێت بۆ پەروەردەکردنی گیانی مرۆڤ

و ویژدان و ڕەوشتی کەسایەتی و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی، واتە سیستەم و بەرنامە و ئاینی ئیسلام دەبێتە یاسایەك بۆ پێکهێنانی خێزان و ڕێکخستن و بەخێوکردنی و هەروەها پاراستنیشی،هەروەها دەبێتە یاسایەك بۆپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی، لەوانەش ئەو پەیوەندییانەی کە هاوڵاتی دەبەستێتەوە بە دەوڵەتەوە، لەکۆتاییشدا دەبێتە یاسای مامەڵەی دارایی و پەیوەندییەکانی ئابووری ناو کۆمەڵەوە، لێرە لەم بوارە کەمەوە شتێکی سەختە درێژە بەمە بدەن، تەنها ئەوە ئەڵێین هەرکەسێکی خاوەن پێویستی لە نیشتیمانی ئیسلامیدا مافی کەفالەت کردنی لەسەر کۆمەڵە و، پێویستە لەسەریشی کاربکات نا هەر بۆ لایەنی مادیی، بەڵکو لە هەموو لایەنەکانی مرۆڤایەتییەوە کە دەگونجێت لەگەڵ خەسڵەت و ئاکار و تایبەتمەندێتی ئەو مرۆڤ و بەندەیەی کەوا خوا کردویەتی بەخەلیفە لەسەرزەویدا و، ڕێزی لیناوە و بەبەرزتری ناساندووە لەزۆربەی دروستکراوەکانی تریەوە، یاسا و سزا و ئاکار و تیلاوە و تەزکیە و تەعلیم و رینماییەکان لەسیستەمی ئیسلامدا چەند ڕێگەیەکن بۆ بەئەنجام گەیشتنی ئەم مەتڵەبە ئیلاهییە کە خەلیفەبوون و جێنشینبوونی مرۆڤ و ئاوەدانکردنەوەی زەوی یە بە فەرمانی خودا، ئیتر ئەم بنەمایە بەفراوانترین شێوە پیادە دەکات چ ئەوەی پەیوەندی داربێت بە ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان و هەروەها ئەوەش کە پەیوەست بێت بەکاری مادییەوە،

فەرموودەیــەکی پــیرۆزی خۆشەویــستیش ئــەم پاراســتن و بەخێوکردنە بەشێوەیەکی وردتر کورت وپوختە دەکاتــەوە کە دەفــەرموێت: «عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بِنِ عُمَرَ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ:« أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»

رواه مسلم وبخاري:

واتــە هــەمووتان شــوانن و هەمووشــتان بەرپرســیارن لــەو شوانیەتی لەو شتەی لە ژێردەسەڵاتتان دایە.

# کۆمەڵگەیەکی جیهانی

لـە دواجـار سـیـفەتـەکانی کۆمەڵگـەی ئیـسلامی کـە جیـای دەکەنـەوە لـە هـەموو کۆمـەڵگا زۆر و زەوەنـدەکانی تـرەوە کـە ناتوانرێ باسی لێ بکرێت لـەم نووسینەدا، ناچار بەتـەنها باسی دوا سیفەتی دەکەین کە کۆمەڵگەیەکی جیهانییە، چونکە ئـەوانی تر هەمووی بریتی ئەبێت لەم سیفەتانەی کەباسمان لێوە کـردن، کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیـەکی جیهانییـە و نەتـەوە خـوازی نییـە بـەو چەشـن و مانایـەی لەسـەردەمارگیری ئـایینی دامەزرابێت، بـەڵکو کۆمەڵگەیـەکی کراوەیە بـۆ هـەموو کەسانێ بەبێ بایەخ دان و ڕەچـاوکردنی نـەژاد یـان ڕەنگـی پێـست یـان زمان یان هەر تایبەتمەندییەکی تری ئیلاهی کـە چەشـنی ئایـاتی خودایین بۆ جیاکردنـەوە و دواتـر تـەعاروفی گـەل و نەتـەوەکان لەگـەڵ یـەکتر، تەنانـەت سـەیری ئـایین و بـیرو باوەڕەکـانیش

ناکرێت و لەپاشدا هەموو چینەکانی مرۆڤ و هەموو جۆرە رەنگ پێستەکان و هەموو زمانەکان و هەموو بیروڕاکانی سەربەخۆ ماوەیان هەیە کۆببنەوە لەژێر ئالای ئیسلامدا و لەژێر یاسا کۆمەلایەتییەکەیەوە، کە هەست دەکەن پەیوەندییەك هەموویان پێکەوە دەبەستێتەوە، ئەویش پەیوەندی مرۆڤایەتی بەستراوە بەڕێگەی خواوە کە جیاوازی ناکات لەنێوان سپی و رەش و باکوورو باشوورو رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی، هەتتا لەنێوان بیرو رایەك ویەکێکی تریش، هەتتا ئەوانەی لەبیرو ڕاشدا یەك نین لەگەڵ ئیسلامدا بەڵام دژی خواو پێغەمبەر ناوەستن و شەڕیش ناکەن لەگەڵ سیستەم و کۆمەڵگەی ئیسلامیدا و خراپەش لەزەویدا ناکەن، پاش ئەمە سەربەستیەکی تەواویان هەیە لەبیروڕاو لەپەرستن و، تەنانەت پێویستە لەسەرموسلمانانیش بیانپارێزن لەهەموو دوژمن کارییەك، هەروەك خودای پەروەردگار لەقورئان و شەریعەتە بەهادارەکەی دەفەرموێت:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾

سورة الحجرات ١٣.

﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ

الْمُقْسِطِينَ (٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٩)﴾ سورة الممتحنة ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ سورة المائدة ٨.

له بیر و بینش و دیدگای ئیسلامیدا كه باوەڕ بوون بەیەك خودا سەرچاوەی سەرەكی دڵ و كار و كردەوەكانە لە هەڵسوكەوت و هەڵوێستی مرۆڤەكاندا، یەكێتی دروست كراوەكان پێكدێت و دواجار بیرێكی لێ هەڵئەقوڵێت كە ئەویش یەكێتی مرۆڤایەتییە، ئیتر ئەم جۆرە بیر و بینش و بەرنامەیە فەرمان نادات بەدەمارگیری دژی نەژاد و ڕەنگی پێست و زمان و داب و نەریتە تەندروستەكان، ئیتر ئەم خەسڵەت و سیفەت و تایبەتمەندیانەشە سیستەمی ئیسلامی دەگەیەنێت بەوەی ببێتە سیستەمێكی جیهانی و، كۆمەڵگەی ئیسلامیش ببێتە كۆمەڵگەیەكی دوور لەنەژادی، نامەزهەبی، لەبەرئەوەی لەسەر بنەڕەتی بیرو باوەڕێكی ئاسمانی دامەزراوە و، گرینگییەكی گەورە ئەدات بەلایەنی ڕەوشتەوەو، هەروەها بەرزكردنەوەی گیانی مرۆڤ لە هەڵسوكەوت و بۆچوونیان بەرامبەر خودا، ئەمەش یاسای كۆمەڵایەتی ئیسلامی ئەرازێنێتەوە كەهاوتای

نـەبێت لەهـەموو ئـەو سیـستـەمانەی کەمرۆڤایـەتی بەخۆیـەوەی دیوە لەپێش هـاتنی ئـاینی ئیـسلام و دوای هاتنیـنـی، هـەروەك خودای گەوردش ئەفەرموێت ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّة وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ سورة المائدة٣.

## کۆتـایی

**وصل الله على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم**

